# باغچەی بەهەشت

## بە شیعر






موناجات نامە

مەولودنامە

میعراج نامە

جێژنە ئاینییەکان

وە بەشێک لە هۆنراوە کانی

ئاینی و کومەڵایەتی

حاجی عەبدولقادر قادری

« هیوا »

# باغچەی بەهەشت

بە شێعر

موناجات‌نامە
مەولودنامە
میعراج نامە
جێژنە ئایینی یەکان
وە بەشێک لە هۆنراوەکانی
ئایینی و کۆمەڵایەتی

حاجی عەبدولقادر قادری
« هیوا »

قادری، عبدالقادر، ۱۳۱۳ -
باغچەی بەهەشت : موناجات نامە، مەولودنامە، جیژنە ئایینی یەکان، هونراوە کانی ئایینی و کومەلایەتی/ عەبدولقادر قادری "هیوا" ــ مهاباد : عبدالقادر قادری، ۱۳۷۷ .
دو، ۷۱ ص .
ISBN 964-5800-61-7
فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا (فهرستنویسی پیش از انتشار) .
۱. شعر مهابادی -- قرن ۱٤ . ۲. شعر مذهبی کردی -- قرن ۱٤ . الف.عنوان .
PIR۳۲۵۶/ق۱۵م۸٤۳ ۸ فا۹/۲۱ م۷۷-۱۲۵۸۵




# باغچەی بەهەشت

● ناشر و مؤلف : عبدالقادر قادری « هیوا »
● نوبت چاپ : چاپ اول ۱۳۷۷
● چاپ و صحافی : علامه طباطبایی
● تیراژ: ۵۰۰۰
● لیتوگرافی : تندیس
● حروفچینی و صفحه‌آرایی : مهاباد، علیپور
● نشانی ناشر : مهاباد، خیابان حافظ، فرش سرای هیوا، تلفن ۲۴۲۹۱

ISBN 964-5800-61-7
شابک ۷-۶۱-۵۸۰۰-۹۶۴

# ناوەرۆک

به‌ ناوی خودا

«حمد» هەر شایانی «الله» یە، کە هەر خۆی بەتەنی خوایە وگشت کار لە دەستی ویدایە، توانایی بێ بەر و دوایە، و «حمد»ی بەکەس دوایی نایە، - «مدح» یش شیاوی پێغەمبەرە (٣) ، کە دڵ پشکوێن و غەمبەرە، پێغەمبەری (٤) هەموجیهان، بۆگشت زەمان وگشت مەکان، ڕۆژی هەوای ژینی بەشەو نەبوە و نابێ هەتاکو سەر، لەوگەورەتر لە خوابەدەر،

باشان خوێنەرانی بەڕێز! بە هەرچاوێک بڕوانینە [illegible] بەری ئەوکە سەری ماوەنی دیتی و فامینە، لە خوابەدەر بۆ «حمد» وە لە پێغەمبەر (٣) باشتر بۆ «مدح» کەسی دیکە ن نینە، یانی لە جیاتی «حمد»ی خودا و «مدح»ی پێغەمبەر (٣) بێ هەڵکوتن بە گوڵ یا ئەوینی بەکوڵ، ج نینە

بەو لۆیە کاتێکی بەڕێز «حاج عبدالقادر قادری» هیوای خۆمان لەکۆما شیعرێکی کە بۆچاپ ئامادەی کردبو، چەند بەستەیکی بۆ خوێندمەوە و دیتم سەرپاکی «حمد»ی خوداو «مدح»ی پێغەمبەرن و حاجی قۆڵی «همت»ی هەڵماڵیوە و چاکی کوتی شیعری چاکی بۆ ئەوان هەڵبەستان بەلاداکردوە، بەیانەی. هیوام ئەنگوت وگوڵی دڵم پشکوت و دامەلانی «سکوت» هەتاهەموویانم بیستن، وزانیم نمرەی هەموان بیستن، خودا پتر یارمەتی بدا

مەهاباد - پازدەی بەفرانباری ٧٧ - عبدالله حەمەیان

# غەزەل

## موناجات (١)

یارەب هەمو کاری تۆ ڕەوایە غەیرەز وی هەچی بلێین هەوایە
هیچ کات و زەمان بۆ کاری تۆ نین هەر (کون فەیە کون)[1] ڕەوایە، وایە
زیکری تۆ ئەگەر بە دڵ بوترێ بۆ هەرچی نەخۆشیە شفایە
هەرکەس کە غروری بێوجەهالەت بێ هیچە، فەقیرە، بێ نەوایە
موحتاجە بە تۆ تەواوی مەخلوق گەر بێ کەسە، گەر غەنی، چ شایە
گەر پۆشتەو کۆکو لێکو پڕ بێ زۆر ڕوتە، ڕەجاڵە، بێ کەوایە
هەرکەس حەق و حق وتن وەلا نێ هەر چی کە بلێ هەوایە، بایە
قورئان و موحەممەد و شەریعەت هەر یەک وەکو سەنگەر و قەڵایە
ڕێی ڕاست و دروست دەبێ بناسین لەو ڕێیە کلا ببین، خەتایە
نابێ خۆ بە زۆر و زل بزانین چون ئاخر ئەچینەوە، فەنایە
بۆ مات و مەلولی و کەساسی هەر یادی تۆ مەڵحەمە و دەوایە
تەخسیر و خەتای «هیوا» گەلێکن بەخشینی تۆ ئارەزوی هیوایە

من بێ کەس و بێ پەنا و پشتم
هەر تۆی کەسی بێ کەسان، خودایە

مەهاباد - ڕێبەندانی ١٣٧٦ ی کۆچی - هەتاوی

---

١ - ئایەی شریفە لە سورەی یاسین «ص» :
إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونَ.

# موناجات (٢)

ئەی خوایە بە ئەمری تۆیە خامەم
رازاوە بە نێوی تۆیە نامەم
ئەی نێوی تۆ ویردی سەر زبانم
بێ نێوی تۆ گێژ و هیچ نەزانم
خوای هەر دو جیهان ئەتۆی خودایە
بم بورە لە تۆ دەکەم تکایە
رۆزی دەری هەرچی مار و مێر وی
خولقێنەری کەم بەش و بە ئێروی
خوای ئاو و هەوا و هەتاو و هەوران
زریان و شەماڵ و چەرخی دەوران
خوای لاڵ و کەڕ و نەزان و زۆرزان
خوای بێ کەس و بێ نیاز و بەرزان
خوای خاوەنی هەست و بیرەوەر تۆی
خوای بون و نەبون و زیندەوەر تۆی
خوای باغی گوڵان و شاخ و بەردی
خوای سێبەر و تاو و ساو و هەردی

خـوای بـۆ هـەمو سـەروەرانـی دنـیا
مـەخلوقی تـۆ جـوتە خـۆت بە تـەنیا
سـەنعەتگەری نـەخشی دوو جیهانی
زانـــای هـــەمو ئـــاشکرا و نـــەهانی
تـۆ هــەر هــەی و بـوی و ئـێمە فـانی
هــەرچــی دەکـرێ و دەبــێ دەزانــی
ســوڕی شـەو و ڕۆژ بـە دەستی تۆیە
ئــــەستێرە بـــە ئـــەمری تـۆ لەکـۆیە
رازاوە بــــە حــــوکمی تـــۆیە دەوران
عـــەللامە لە عــیلمی تـۆیە حـەیران
هـــــەوراز و نشــێوی ژیـــن بــە تــۆیە
ئــەحکام و کـەلامی دیــن بــە تـۆیە
خـــاوەن کـەرەم و کــەماڵ و نــوری
جـێی خـۆیەتی گـەر لەمـەش ببوری
ژیـــــنێکم ئـــــەوێ لە تـــۆ خـــودایــە
عــومرێکی هــەمە نــە چــێ بــە زایــە
بــۆ خــزمەتی خـەڵک سـەر بـەرز بـم
نــەک مـۆرەیەکـی شـل و هـەرز بـم
کــوردم دەمــەوێ بـژیم بــە کـوردی
ژیـنی بە شـەڕەف مـەرگ بـە مـەردی

«هــــیوا» بــــە هــــیوایــە تــا بــمێنێ
ســـەربەرزی گـــەلی بــە دەست بــهێنێ
هــــەروا دەیـــەوێ بگـــا بــە ئــامانج
بێ بۆ گەلی خۆی بە کەڵک و قـازانج

رەزبەریساڵی ١٣٦٧ی کۆچی هەتاوی
مەهاباد - «هیوا»

# موناجات (٣)

لە سەرکێش و وەزنی موناجاتی
حاجی قادری کۆیی

ئــەی بــێ بــەدیل و وێــنە هــەرتۆی کــە کــردگاری
نـــــەخشی ڕەواق و تـــاقی، نـــەخشێنەری نـــیگاری
نـــەخش و نـــیگاری گــەردون لە بــونی نــەخشی تــۆیە
نـــەخشێنەری زەوی و زار، بــێ نــەخش و بــێ نــیگاری
ئــەستێرە پــاکــی دەخــوشن، زیندو لە عــەرزی دەخشن
تـــاق و ڕەواقــی تــۆیە، هــەم نــەخشی هــەم نــیگاری
ئــەو تــاو و ســاو و عــەردە ئــەو شــین و ســور و زەردە
ئــەو کــێو و شــاخ و بــەردە، نــەخشن لە نــەخشی باری
ســـەرما بـــە یـــەددی تـــۆیە فـــێنکی هــەمو دڵانـــی
گـــەرما بـــە حـــوکمی تـــۆیە، خـــەمڵێنەری بـــەهاری
خـــولقێنەری دو عـــالەم، عـــالەم چـــەمان و مـــانی
کـــێو و چـــیا و چـــۆمی، دۆڵ و تـــەلان و غـــاری

ئـــەمارەتی بـــە تـــۆیە، ئـــەی داوەری دو عـــالەم
هـــەر ئـــەمری تـــۆ بـــە کـــارە بـــۆ گشـــتی کـــار و بـــاری
ســـەتتاری بـــێ ســـنوری، جـــەبباری بـــێ فـــتوری
قـــەههاری بـــێ قســـوری، داداری نـــادیاری
ســـەبباری و ســـەبوری، غـــەففاری و غـــەفوری
خـــەللاقی بـــێ حـــزوری، هـــەر تـــۆی کـــە بـــەرقەراری
لەبـــەر وەیـــە کـــە «هـــیوا»ش، هـــاوار ئـــەکا بـــە کـــوردی
چـــون تـــۆ هـــیوا و هـــومێدی هـــەمو گـــەلی هـــەژاری

٣ی بانەمەڕی ١٣٧٧ ی هەتاوی
حاجی قادر قادری
هیوا

# موناجات (٤)

بە نێوی خودای بەرز و بێ هاوال
گیاندەری هەرچی نەوی و بالایە
ئەو دەیدا ڕۆزی مار و مێرولە
گیانلەبەر بەوی گیانلەبەریایە
هەر بەویت بون و نەبون و ژینە
بژێویت بەویەو مەرگت لەوڕایە
بۆ خۆی دەزانێ چۆنی دەگێڕێ
ڕاگری زەوی‌و حەوت حەوایە
نوسندەی بێ‌خەم بەبێ‌ژومارە
ڕۆزی دەهەندەی شاووگەدایە
هەرکەس ئیمانی بە حەق پێ بێنێ
لە بوردنی[1] سوچی وەعدەی درایە
توانینی تەواو تەنیا بۆ ویە
قادر هەر ئەوە، تاق و تەنیایە
هەر چەند تاریفی بکرێ هەرکەمە
بێ وێنەی نوێنەر لە تاریف نایە

---

١ ـ تاوان، گوناه

# موناجات (٥)

## ڕاز و نیاز لەگەڵ خودا

خــــودایــە کــاری ئـێمە روبـەراکـەی
گـرێ پـوچکە لە ڕایـەڵمان ڕەهـا کەی
لەگەڵ یەک ڕاست و یەکرەنگ و وەفادار
ژن و پـــیاوو جـحێڵمان بـێ بـەڵاکـەی
بـــە ئــیمان و ئــەمانەتدار و لەش ساغ
لە دوو دنـیایە ئـەحواڵـی مـە چـاکەی
لە مـەیدانـی جـیهاد و ڕەجـمی شـەیتان
بـە نـەگـبەت دوژمـنی مە، موبتلاکەی
قـەڵاو کـۆشکی بـڕوخێنی و نوقم کەی
کـەلێن و کەپرو کـاولی مەش قـەڵاکەی
ئـەسیری نەفسی سەرکێشیش نەبین قـەت
لە چـنگ شـەیتانی زاڵـممان ڕەهـاکەی
لە تـەپکەو داوی دووڕوو بـا بە دوربین
هــەمو مـەکـرو فـریوی بـەرمەلاکـەی
بـــە ســەربەرزی بـژین ئـەولادی ئـێمە
خـــودا! ڕاز و نــیازی وان ڕەواکـــەی

بـــە دیـــن و عـــالم و زانـــا و عـــاقڵ
لە جـەهل و غـەفڵەت و کـینە کـلاکـەی
فـڕۆکـەی سـەنعەت و تـێکنیک و زانست
بە عـیلم و هـۆش و بیری وان حـەواکـەی
بت و بـــــتخانە و کـــوفریش نـــەهێڵی
بـــەڵامان دور و ئـــاواتـمان ڕەواکـەی
ئـــەوەی بـــەدخوازو زۆردار و نـــەفامە
ئـەسیر و دەربـەدەر تـەرت و تـوناکـەی
هـەمو غـەمخۆر و یـار و یـاوەری یـەک
عـەمەلمان چـاک و بێ ڕوو و ڕیـاکـەی
بە کەیف و شـاد و سـەر خـۆش و نەبەزین
لە ڕەنج و نەگبەت و غـەممان جـوداکـەی
پـەڵەی ڕەحـمەت بـە سـەرمانا[1] بـڕێژی
بـــرین و ئـــێش و ئـۆفی مـە دەواکـەی
عـــەداڵـەت بگـرێ سـەرتاسەر وڵاتـان
هـەمو خـانوی زۆڵـم وێکـڕا خـراکـەی
«هـیوا» ئـاواتـی خـزمەت بـۆ ڕەزای تـۆ
ئـەتۆش حـاسڵ کـە ئـاوات و هـیواکـەی

مەهاباد ٩ ی بانەمەڕی ١٣٧٢ ی کۆچی هەتاوی

١ - بە سەرماندا

# موناجات (۶)

وەرگێڕاو لە فارسی‌یەوە بە کوردی

## «ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»

ئـەی لێ بـوردوی گـوناهباران　　ئــەی دڵـنەوای تـۆبە کـاران
ئـەی زانـا بـە عـەیب و عـاران　　«ئەی خودای گەورە تـۆبە بـێ»
ئـەی خـالەقی عـەرز و حـەوا　　لێ بـــوردو لە ســوچ و خـەتا
لێـم بـبورە هــەر تـۆی خودا　　«ئەی خودای گەورە تـۆبە بـێ»
چون ئاخری پـێ دێـتن نـەفەس　　دەفـرێ مـەلی روح لە قـەفەس
یارەب هـەر تۆی فـەریادرەس　　«ئەی خودای گەورە تـۆبە بـێ»
زۆرم هـــەیە ســوچ و تـاوان　　نـەفس و هــەوام فـەرمانڕەوان
شاهید بـەوەم، عـەرز و حـەوان　　«ئەی خودای گەورە تـۆبە بـێ»
لە هــەرچـی کـردم بـێ ئیزن　　هــەرچـی لە کـن تـۆ نـاحەزن
لەوەی قـــەڵەو یـا خـۆ کـزن　　«ئەی خودای گەورە تـۆبە بـێ»
چون دەڕوا ئاخر نەفسی پەست　　دەفرێ مـەلی لەشـی دەربـەست
هەر تۆی یارەب هاوار و هەست　　«ئەی خودای گەورە تـۆبە بـێ»
بـە فـەزلی تـۆم هـەیە هـومێد　　یـارەب تـۆ نـەمکەی نـاهومێد
رەحـمت بـە مـوی سپیم دابێد　　«ئەی خودای گەورە تـۆبە بـێ»

کاتی پرسیاری نێو قەبر　　زیانم واکەی بۆ دەور
رەحمت بباریٚ وەک هەور　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
وەختی پرسین کاتی خیتاب　　نەگیریٚ زمانم یا وەهاب
خۆم عاجزم وەختی جواب　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
ئەمن عەبدێکی چوکی تۆم　　قورمیش کراوو کوکی تۆم
چاک یان خراپ بم روکی تۆم　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
لە حەشر و نەشر و لیٚ پرسین　　هاوار، رەببەالعالەمین
تۆی پادشای رۆژی یەقین　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
بە منیش ببەخشە ئەی کەریم　　بەهەشت و حۆری و نەعیم
نەسوتێم بە ئاوری جەحیم　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
خۆم عاجزم پیر و فەقیر　　تێماوم هەر تۆم دەستگیر
عوزرم قبولکە بمکە ژیر　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
ئەی رەحمەتت دەریای عام　　قەترێک بە من ببریٚ رەزام
رەحمیٚ بە منکەی، بیٚ پەنام　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
هەلٚم هێنا دەستی نیاز　　لە دەرکی تۆ ئەی کارساز
زانا بە هەر راز و نیاز　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
یارەب بکەی رەحمیٚ بە مە　　ژینمان هەموی پر ماتەمە
لادەی لە سەرمان ئەو تەمە　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
دە گوناهاندا سەرگەردانم　　سەربەخۆم و نافەرمانم
ئێستاش گەلێک پەشیمانم　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بیٚ»
پەنام هێناوە ئەی خودا　　گوناهم زۆرە و بیٚ پەنا

بە فیرۆ با نەبم فەنا　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
هەم دەرد و دەرمانم ئەتۆی　　هەم رێ نیشاندەرم ئەتۆی
رەحیم و رەحمانم ئەتۆی　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
پشودانم، بیرم، ئەگە　　نیمە کەسێک هەر تۆ مەگە
یارەب بە هاوارم بگە　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
عومرێ بە باتڵ رۆیوم　　دایم بە غافڵ رۆیوم
ئەورۆکە عاقڵ رۆیوم　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
نە سەبرم هەیە بۆ بەڵا　　نە شوکرێ بۆ لوتف و عەتا
نە بۆ قەزایی حەق رەزا　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
تا من لە دایکی خۆم بووم　　دەنێو گوناهان کەوتووم
بۆ نێو و شۆرەت زیندووم　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
تابع بە شەیتان بوم ئەمن　　غافڵ لە رەحمان بووم ئەمن
هەمیشە حەیران بووم ئەمن　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
هەمە گوناهی بێ شمار　　کۆمەک لە تۆ بە دڵ و بە زار
گەراومەوە پیر و هەژار　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
گەلێکم کردوە، زوڵم و زۆر　　لە خۆم و ئیدی، نۆر بە نۆر
پەشیمانم ئێستاکە، زۆر　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
نە شەرعم هەڵبژاردووە　　نە رێگای حەقم گرتووە
ئێستاش زبانم بەستووە　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
غافڵ بوم لە حاڵی خۆم　　لە کردەوەی محاڵی خۆم
هاتمەوە سەر ئەحواڵی خۆم　　«ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»

هەم چارەیی کارم، ئەتۆی — هەمیشە هوشیارم ئەتۆی
غەففار و سەتتارم ئەتۆی — «ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
تاکەی بڕۆم گومڕا ببم — سەرگەشتەو ڕیسوا ببم
یارەب ڕەحمکەی، چابیم — «ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
چاک یان خراپ بم ماڵی تۆم — لەو ماڵە دا میوانی تۆم
لە سەر سفرە و سەرخوانی تۆم — «ئەی خودای گەورە تۆبە بێ»
فیزو هەوا دەرکەوتووم — لەبەر دەرکت وەرکەوتووم
تەن بە قەزا کر کەوتووم — ئەی خودای گەورە تۆبە بێ
یارەب قبوڵ کەی لێم دوعا — «هیوا»ش لە تۆ دەکا تکا

بببخشە، ئێمەی بێ پەنا
ئەی خودای گەورە تۆبە بێ

کاتی نوێژی سبحەینێ بە جەماعەت لە مزگەوتی حاجی ئەحمەد، ئاغای کاک محەممەدی بلوری ئەو موناجاتە کە بە فارسی نوسرابو، بە نێوی (جرم بخش) دایمێ وکوتیشیان هی سەعدی‌یە «علیه‌الرحمة» منیش وەرمگێڕاوە سەر زبانی کوردی. خودا جەزای بەخێری ئەوانیش بداتەوە.

ڕەمەزانی ساڵی ٧١ ی کۆچی هەتاوی

مەهاباد – «هیوا»

# مولودنامە (١)

## ببنە برا

ئەی موحەممەد ئەی موحەممەد ئەی ئەمین
ئـــەی حـــەبیبی زاتـــی رەبـــەلعالەمین
تـــۆ نـــمونەی حیلم و روحـم و ڕەحـمەتی
تـــۆ نیشانەی قـەدر و قـودب و شـەوكەتی
ئەی موحەممەد ئەی چرای ڕونـاكـی دیـن
تـۆ مـولەققەب بـوی بـە لاوچـاكـی ئـەمین
تـەوسیەی تـۆ بـو كـە فـەرموتە یـەقین
هـەر بخوێنن گـەر بـڕۆن بـۆ وڵاتـی چین
هـەر بـە تـۆ ئـادابـی دیـنی حـەق درا
حـوكمی تـۆ هـات، پشتی زۆرداران شكـا
دیـــنی تـــۆ ئـــایینی حـــەق و راسـتی
لەو بـــەڵای گـــەورە خـودا پـاراسـتی
داوی جـاڵجاڵۆكـە پـەردەی عـیسمەتت
ماری غـار دەخـوشی كـە بێ بۆ زیـارەتت

تۆ بو پێت فەرمو مەبە غەمگین بە یار
یاری سەددیقت دەگەڵ تۆ دا لە غار
خوا دەگەڵمانەو ئەمینە جێگەمان
دوژمنیش ناتوانێ بگرێ رێگەمان
دینی تۆ ئایینی سوڵح و رەحمەتە
شوێنی تۆ خەتت و نیشانی وەحدەتە
تۆ لە بەینت برد بت و بتخانەکان
تۆ شکاندت پشتی گشت زۆردارەکان
تۆ نیشانت دا بە خەڵکی خوڵقی خۆش
دینی تۆ دنیای هێنا جۆش و خرۆش
تۆ نمونەی حوسن و خوڵقی(١) ئەعزەمی
بۆ غەم و دەردی هەزاران مەڵحەمی
تۆ دەترسێنی و دەدەی موژدەی نەجات
هان دەدەی ئێمە بۆ رێی بەرزی خەبات
نوری حەق بوی و لەروی ئادەم جەماڵ
دینی ئیبراهیم بە تۆ گەییە کەماڵ
یارەبی بۆ خاتری سالاری دین
گشت موسوڵمانان دە وەحدەت دا بژین

---

١ - ئایەی ٤ سورەی اَلقَلَم : وَإِنَّكَ لَعَلىٰ خُلُقٍ عَظيم

با بە بۆنەی دینی حەق ، حەق بن بەرا
تورک و فارس و کورد هەمو ببنە برا
تا نەمێنێ دوژمنی خوێنخۆری زاڵ
دەست و پێی ببڕین بە گەل بیخەینە چاڵ
هەر بە هیوا بن هەموتان وەک «هیوا»
دینی حەق حەققە و بەتاڵە ماسیوا

* * *

مەهاباد ١٧ ی ربیع‌الاول ساڵی ۶۶ هەتاوی

# مولودنامە (٢)

## ئەسسەلام

ئەسسەلام ئەی سەروەری گشت سەروەران
ئـــەسسەلام ئـــەی خـــاتەمی پـــێغەمبەران
ئـەسسەلام ئـەی مـەنبەعی حـیلم و حـەیا
ئـــەسسەلام ئـەی شـــافیعی ڕۆژی جــەزا
ئـەسسەلام ئـەی پـێشەوایـی مـورسەلین
ئـەسسەلام ئـەی داوەری عـیلمی یـەقین
ئـەسسەلام ئـەی ڕەحـــمەتەن لیـلعالەمین
ئـەسسەلام ئـەی هـەمدەمی روحـەلئەمین
ئەسسەلام ئەی ڕەهبەری گشت خاس و عام
ئـــەسسەلامو ئـەسسەلامو ســەد ســەلام

# مولودنامە (٣)

## یا ڕەسولی حەق

یــا ڕەسولی حـەق یـا حـەبیبی حـەق
مانگ بە ئیشارەی قامکی تۆ بو شـەق
بـۆگـەلی ئـیسلام هـەر تـۆ سـەروەری
هــەر تــۆ شـافیعی ڕۆژی مـەحشەری
کەلامی خودات بۆ هات بـە خـەڵات
لە دیـــداری تـــۆ هــەزار سـڵەوات
ئــەتۆی ئـەستێرەی رونـاکـی ژیـنمان
ئـەتۆی سـەروەرو سـالاری دیـنمان
ئــەو ئــۆممەتەی وا تــۆی پشتیوانـی
نــەجاتی دەبــێ لە چـنگ شـەیتانی
ئەوکەشتیەی کە وا تـۆی کـەشتیوانـی
تـــەزمین کـــراون دانـــیشتوانـــی
ئـــەتۆی خـــاتەمی گشت پــێغەمبەران
ئــەتۆی سـەروەری هـەمو سـەروەران

بە ئایەی خودا تۆی خەیرولبەشەر
شکا دەستی وەی لە تۆی دا تەشەر[1]
ئەی سیراجی حەق سالار و سەروەر
ئوممەتی ئیسلام بە تۆ بەختەوەر
ئەتۆ مەزهەر و پەنای نەجاتی
ئەتۆ شەوچرای ڕێگای خەباتی
حاجی لەگوناه سەری سوڕماوە
بە «هیوا» پەنای بۆ تۆ هێناوە

مەهاباد - ۱۳۶۶ ی هەتاوی

« هیوا »

---

١ - ئیشارە بە سوڕەی لَهَب : ( تبّت یدا أَبِی لَهَبٍ وَّ تَب .....)

# مولودنامە (٤)

## خۆرەتاو

ئـەستێرێک خـوشی کـەوتە سـەر وڵات
ڕونـاک بـو زەوی، تـاو و سـاو هـەڵات
قـیست و عـەدڵ و داد وڵاتـی داگـرت
دێوی زوڵم و زۆر خۆی نەگرت، هەڵات
ئـاسوگ ڕونـی کـرد، دای لە پـەنجەران
تیشکی خـۆرەتاو، لە کـۆشک و قـەڵات
بـە حـوکمی خـودا بـە نـەزم بـۆی هـات
بـــۆ پـێغەمبەری قـورئان بـە خـەڵات
ئـــیسلام شکـــاندی پشـــتی زۆرداران
زۆرە مـــلی نـــەما، رزگـــار بـــوو وڵات
ئـــاڵای ئـــــیسلامێ دەلەرێـــتەوە
دەسـتوری قـورئان بـو بـە هـۆی نـەجات

***

# مولودنامە (٥)

## ڕوو دەخوداکەن

یاران وەرن ئەم چاکە بکەن ڕوو دەخوداکەن
لەو ڕێگەیەدا ماڵو سەرو روحو فیداکەن
هۆی قودرەتی ئەڵلایە ، هەموی دیمەنی دنیا
بۆ گەورەیی ئەو خوایە بە دڵ حەمد و سەناکەن
ئەو خاتەمە وا ئێستێکە نێودێرە لە نێومان
بۆ عیززەتی ئەو ناوە هەموو دەست بە دوعاکەن
گەورەی هەمو مەخلوقی خودا ناوی «محّمد»
بۆ گەورەیی ئەو زاتەیە مەحمودێ سەناکەن
قەت ساتێ مەوێستن لە ڕەجا و ویرد و دوعای خێر
بەونایو دەفو ویردی خودا قەلبو سەفاکەن
چون نێعمەتی بێحەددی خودا، نایەتە ئەژمار
بۆ شوکری هەمو نێعمەتی حەق دەین و ئەداکەن

ئەی میللەتی کورد بۆ وەخەبەر نایەن و نوستون؟!
هەستن بە عەمەل پێکەوە لەو خوایە تکاکەن
با پەرچەمی ئەو دینە بەرز بێ لە ولاتان
بەم جۆرە دەبێ ڕێک بکەون، جێژنێ بەپاکەن
دەردی مە نەزانین و حەسادەت وە نیفاقە
بە خوێندنی قورئان و عەمەل، دەردو دەواکەن
«هیوا» کە دەناڵێنێ بۆ گەل زامی بەسۆیە
هیواو گەرەکە، دوبەرەکی وێڵ و ڕەهاکەن
ئاواتی «هیوا» وەحدەت و یەکپارچەگی بۆگەل
بۆگەینی بە ئەو ئارەزووە ڕوو دەخوداکەن

مانگی مەولودی ١٣٧١ ی کۆچی بەرابەری ٢٣ ی خرمانان

« هیوا »

# مولودنامە (٦)

یـــا ڕەســـولەڵڵا، خــەتمی ئــەنبیا
فــرشتەی زەوی، شـــاپەڕی حــەوا

***

نـیۆت مـوحەممەد، لەقـەب ئـەمینە
بـــابت عـــەبدوڵڵا، دایکت ئـــامینە
یـــا ڕەســـولەڵڵا، ســـفەتت ســـەفا
هـەلبژاردەی حـەق، نـیۆت موستەفا
یـــا ڕەســـولەڵڵا، سـەرداری عـالەم
خـولقای لە ئـەزەل، لە نـەسلی ئادەم
یاڕەب بۆ خـاتر، سەرداری ئوممەت
بـڕژێنیە سـەرمان بـارانـی ڕەحـمەت
یـارەب بـۆ خـاتر، نـمونەی بـەشەر
ڕزگـاریمان بـێ، لە دەشـتی مـەحشەر

مەهاباد - ١٢ ی ربیعولئەوەلی
ساڵی ١٣٧٥ هەتاوی
«هیوا»

# مولودنامە (٧)

## مەولودی موبارەک

محەممەد ئەی مـحەممەد ئـەی مـحەممەد
موبارەک نێوت ئەی ئـەحمەد مـحەممەد
مـــحەممەد خـــاتەمی گشت مــورسەلینە
مـــحەممەد ڕەحـــمەتەن لیـــلعالەمینە
مـــحەممەد شـــافیعی ڕۆژی جــەزایــە
مـــحەممەد ئـــەشرەفی گشت ئـەنبیایە
« محەممەد ئەی محەممەد ئەی محەممەد
موبارەک نێوت ئەی ئەحمەد محەممەد »
ئـــەوا جـــێژنی لە دایک بـــونی تـــۆیە
هەموی مـەجنون و شـەیدای بـونی تـۆیە
مــوسوڵمانان، مــوسوڵمانان، مـوسوڵمان
مـوبارەک جـێژنی مـەولودێ لە هـەموان
« محەممەد ئەی محەممەد ئەی محەممەد
موبارەک نێوت ئەی ئەحمەد محەممەد »
مـــحەممەد ســـاحێبی قـــورئان و دیــنە
مـــحەممەد مـەزهەری عـیلمی یـەقینە

مـحەممەد ڕایـەتی ئـەحکامی شـەرعە
مـــحەممەد ئـــایەتی تـەقوا و وەرعـە
« محەممەد ئەی محەممەد ئەی محەممەد
موبارەک نێوت ئەی ئەحمەد محەممەد »
مـحەممەد نـەوگـوڵی بـاغی عـەداڵـەت
مـــحەممەد لابـــەری زوڵـم و زەلالەت
مـحەممەد ڕابـەری گشت خـاس و عـامە
مـحەممەد سـەروەر و گـەورە و ئـیمامە
« محەممەد ئەی محەممەد ئەی محەممەد
موبارەک نێوت ئەی ئەحمەد محەممەد »
مـــحەممەد کـــاشفی عـەرشی بـەرینە
مـــحەممەد پـێشەوای گشت مـورسەلینە
مـحەممەد شـەوچرای ڕێگـای نـەجاتە
مـــحەممەد مـەزهەری عـیلم و خـەباتە
« محەممەد ئەی محەممەد ئەی محەممەد
موبارەک نێوت ئەی ئەحمەد محەممەد »
مـــحەممەد تکـیەگـاهی بـێ پـەنایە
«هـــیوا» هـــاواری بـەرزە بـۆ تکـایە
مـــوسوڵمانان مـــوسوڵمانان مـــوسوڵمان
مـوبارەک جـێژنی مـەولودێ لە هـەموان

# جێژنی مەولود* ( ١ )

« جێژنی مەولودی ڕەسولی ئەکرەمە
ئەشرەفی ئەولادی نەسلی ئادەمە »
ئەی تروسکەی ڕۆژی ڕونی موئمینان
ئەی پەنا وپشتی هەتیو و بێکەسان
ئەی گوڵی باغی ریسالەت، ئاسمان
گەر بڵیندە تۆی بڵیندتر بێ گومان
ئەی هومایی بورجی خۆشبەختی بەرێز
هەر لە تۆیە شان و شەوکەت تین و هێز
ئەی شەفیعەلموزنبین سەدرونەبی
تۆی شفاعەت خواز و بۆ گەل موهتەدی

* جێژنە ئایینی‌یەکان دە ئەسڵدا دو جێژنی ڕەمەزان و قوربانە بەڵام پێویستە بزانین جێژنەکانی وەک میعراج، مەولود، بەرات چونکە موسڵمانان عەلاقەیان زۆر پێ بون، بونەتە عورفی شەرعی و نوێژی جێژنیان تێدا بەڕێوە ناچێ.

خـاتەمی، گـەر جـەوهەری تۆ ئـەووەڵە
مـانگی مـیلادت ڕەبـیعولئەووەڵە
هەر نە دوازدە و حەفدە حەوتوی وەحدەتە
مانگی میلادت هـەموی هـۆی ڕەحـمەتە
تـۆی سـتارەی بـەرزی ئاسمانی نـەجات
هەر لەبەر تۆی خوا خەلق کرد، کـائینات[١]
مـانگی ڕونـاکـی شـەوی ئاسمانی ژیـن
شـەوچرای بـەرزی وەفـاو ئیمان و دیـن
تـۆ نـمونەی جـوانـی ئـینسانیەتی
شـاپەڕی بـاڵی، فـرشتەی ڕەحـمەتی
تـۆی نیشانەی حـەق ڕەسـول و ڕەهـبەری
بـۆگـەلی ئـیسلام سـەرۆک و سـەروەری
تۆ لە خزمەت حەق، بە حەق پێیدای خەڵات
تـۆی هـومێدی ڕۆژی حـەشر و عـارەسات
سـەروەر و سـالاری گشـتی مـەخلوقات
ئـۆممەتێک دەسـتەو دوعـایە بۆ تکـات
ئـەی تکـاکـاری لە ڕۆژی تـەنگەنا
وەی عروجت، کەملەیەک شـەو بۆ سـەما

---

١ – حەدیسە و زۆر کوتراوەتەوە: لَولاكَ لَولاك لَمَا خَلَقتُ الافلاک.

بــۆ تکــاکــاری بــە ئـیزنی ڕەبـبەنا
حـەوزی کـەوسەر وەعـدەیە (إِشـفَعلَنا)
ئەی سیراجـی نـوری حـەق خـەیرولبەشەر
هــەم لە ئـیعجازت بـو، بـوو شـەققولقەمەر
ئــۆممەتی تـۆیە بـەحەق خــەیرولئومەم
وەک گــەدایــێکە لە دەرکت مــوحتەشەم
بــونی پــێغەمبەر بـە تـۆ بـوو مـونتەها
نــێوی تــۆ تــاها و یـاسین، مـوستەفا
گەرچی ئوممی بـوی و بـێ خـوێندن بـەڵام
دەرسی قـورئان تـۆ وتت بـە خـاس و عـام
یـاڕەبی بـۆ خــاتری، مــەلودی ڕەسـول
ئـوممەتی ئـیسلام نـەکـەی مـات و مـەلول
ئـەی خـودا بـۆ خـاتری ئـەو ڕەهـبەرە
خـۆت بـبەخشە، قـادریش بـەو سـەروەرە
« جـێژنی مــەولودی ڕەسـولی ئـەکـرەمە
ئــەشرەفی ئــەولادی نـەسلی ئـادەمە »

جێژنی مەولودی ساڵی ١٣٦٥ ی کۆچی هەتاوی

# جێژنی مەولود ( ٢ )

جێژنی مەولودە جێژنی قوڕئانە
جێژنی فرشتەی عەرز و ئاسمانە
جێژنی مەولودە جێژنی ئەوینە
جێژن و بەهاری ئیمان و دینە
جێژنی مەولودە، جێژنی خۆمانە
جێژن و بەهاری دین و ئیمانە
جێژنی مەولودی ڕەسولی خودا
موحتاجن بەوی هەم شا، هەم گەدا
یاڕەب بۆ خاتر ڕەسولی لەولاک
بمان پارێزی لە بەڵای ئەفلاک
یاڕەب بۆ خاتر ڕەسولی ئەکبەر
سەرفەرازمان کەی لە دەشتی مەحشەر
یاڕەب بۆ خاتر ڕەسولی ئەتهەر
بمان پارێزی لە بەڵا و خەتەر
یاڕەب بۆ خاتر موستەفای موختار
بمان پارێزی لە زۆری زۆردار

***

# جێژنی قوربان

لە قوربان من بە قوربانی دەکەم قوربان لە ڕێی حەق دا
سەروماڵ و ڕوح و گیانم بە سەربەرزی و بە ساکاری
ئەوە جێژنێکە مێژویی، بنەی نایا هەتا مردن
لە ئیسماعیل دەبێ فێربن، خەڵک دەرسی فیداکاری
بە فەرمانی خودا لەببەیکی دا لەببەیک، ئیبراهیم
تەعالەڵڵا لەبەر فەرمانبەری و ئەو نەخشی شاکاری
سەرە فیدیە لە قوربانا، ئەوە هۆی جێژنی قوربانە
نیە وێنەی لە مێژودا لە مەیدانی وەفاداری
لە تینی عیشقی مەولا، هاتە جۆش کورەی دەرونی باب
بە دڵ بەخشی ڕوح و گیان و کوڕی دڵبەندو دڵداری
لە مەیدانی عەمەل دەرهات لەگەڵ باب و کوڕیش چاتر
لە ئەستۆی کوڕ دەنێ کێرد باب و، کوڕ تەسلیمی ئاکاری
بە جامی بادەیی حەق هەر دو مەست و مەست بون سەرخۆش
بە حەق تەسلیم بە حەق بو کوڕ، نەبو هیچ هات و هاواری

کە کێردی نا لە ئەستۆی پڕ، بە بۆنەی سەربڕینی کوڕ
نەبو کاری، بەڵام باری، لە ناکاو ڕەحمەتی باری
لە پڕرا ناردی بۆی فیدیە، بەرانێکی سپی چاورەش
کە فەرموی باری، هانێ سەربڕە، زوبە بڵێ ئاری
خودایە خۆت بدەی تۆفیقی «هیوا» وگشت گەلی ئیسلام
بە قسمەت کەی بە حاجی قادریش حەجێکی سێ جاری
جێژنی قوربانی ١٣٦٦ ی کۆچی – هەتاوی

# مانگی ڕەمەزان

مـــانگی ڕەمـــەزان زۆر مـــوبارەکـە
زۆرگـەورە و عـەزیز جـێی تەدارەکـە
مـاڵی خـۆت بـخۆ، قـەرز مـەکـە بۆی
دروستە سێ یەکی مـاڵی خـۆت بـخۆی
سـەرف کـردنی مـاڵ لە ڕێـی خـودادا
گـەر غـەیرەز وەی بـێ ڕەنـجت بـەبادا
ئـەو مـانگە مـانگی مـوسوڵمانانە
مـانگی تـاعەت و کـەسبی ئـیمانە
مـانگێکی پـاک و شـەریف و جـوانـە
وەخـتی تـەهلیلە و خـوێندنی قـوڕئانە
وەخـەبەر وەرن دنـیا فـانی یە
لەززەتـی دنـیا، فـەوری و ئـانی یە
بـۆ تـاقە جـەمێک ڕۆژوی لێ مـەخۆن
فـریوی شـەیتانی لەعـنەتی مـەخۆن
مـەخۆن فـریوی شـەیتانی لەعـین
بـەهەشتی بـاقی و جـەزایـە یـەقین

ڕۆژو تـــاعەتی تـــایبەتی خـــوایـــە
چـــون زاهـــیری نـــیەو بـەبێ ڕیـایە
ئـەو مـانگە مـانگی بـە پـنچ و مـۆرە
مـــردو ئـــاواتـــی ئـەو مـانگەی زۆرە
مـردو بـەشاشن شـاد و سـەرخـۆشن
لە نـیوەی هـەوەڵ زۆر کـەیف خۆشن
لە نـــیوەی دوهــــەم پـــڕ لە مـــاتەمن
خـــــەریکی شـــین و داخ و ئـــەلەمن
«هاڵۆز[1]» خۆت چۆنی دەگەڵ مردوان
مـــەبادا بـــیخۆی نـــە گـــری ڕۆژوان
تـۆش بـەڕۆژو بـەو هـەر دەبـێ وابی
جـا چـۆن تـۆ زیـندوی بـە مـردوی نـابێ

ڕەمەزانی ساڵی ١٣٢٨ ی کۆچی هەتاوی
هاڵۆز (هیوا)

---

١ – دە تـەمەنی ١٨ ســاڵی دا لە دێـی تـازەقەڵای سـەر بـە بـۆکـان کـە موعەللیمی تایبەتی بوم و نازناوی شێعریم «هاڵۆز» بـو کـوتومە و لە لای حاجی مامۆستا مەلا محەممەدی وەلزی خـودا لێـی رازی بـێ کـە لەوێ موددەریسی علومی دینی بو هـاتوچۆم دەکـرد و دەرسـی عـەرەبیشم لە خزمەت ئەودا دەخوێند.

# جێژنی ڕەمەزان

ئـەوە ڕۆیـی تـەواو بـوو مـانگی قـوڕئان
بەخێرچێ هەی بەخێرچێ هەی بەخێرچـێ
ئەوە هات جێژنی ئەو مـانگە لە شـەووال
بەخێربێ هـەی بـەخێربێ هـەی بـەخێربێ

***

کەسێکی نوێژی کـردبێ و ڕۆژوگـر بـێ
دەبێ شاد بێ کە بۆوی جـێژن و سـورە
زەکاتی دابـێ لەو ڕۆزی کـە بـۆ خـۆی
دە دەستی دایـە و پـێی جـەمع و جـورە
لە بـۆ تـاعەت بـچوبێ و نـەیچوبێ نـوێژ
لە مـزگەوتێکی وەک مـزگەوتی سـورە
بەڵام هـەر کـەس نـەچەوسابێ بـە ڕۆژو
دەڵێن بۆ وی بەهەشت نێزیک نیە، دورە
چ حەیفە ئەو کـەسەی بـۆ خـۆی بـزانـێ
کەچی دورکا لە خۆی ئەو قەسر و حورە
بـــەڵێ تـــاریخە ئـــەو جـــێژنە دەمـــێنێ
بە قای ئەو جـێژنە حـەتتا نـەفخی سـورە
دەڵێن جێژنە مـوبارەک بـێ لە هـەموان
نـــەمێنێ دەرد و نـــە گـبەت لەو سنورە

هەر ئەو دەیدا بە مەخلوق ڕسق و ڕۆزی
ئــەوە ڕۆزی دەهــندەی مــار و مــورە

*** 

بەڵێ جێژنە مـوبارەک بێ لە هـەموان
بــبێتە هــۆی ئــازادی هــەمومان
لە دنـیا هـەر بـەرز بێ ڕایـەتی حـەق
بە شمشیری عەداڵەت کوفر، بێ، شەق
بــبایە کــاخی بــێدادی ســەرەو بــن
نەمابا تۆوی، بۆ تۆو، کـوفری دوژمـن
بــــڕوخابا نــــوقم بــــوبا، بــــبا ون
ڕزیـــبا، گــول بـبا، زامــاو و کــرمن

*** 

بــــەڵێ جــــێژنە، لە مــــێژوی کــوردەواری
بـــــە شــــانازی لە کــــن دار و نــــەداری
دەبــــێ وێکــڕا هــەمو بـیکەن بـە جـێژن
مـــناڵ و جـــوان و پـــیر، ژنـدار و بـێژن
بــــڵێن پــــێکتر مــــوبارەک جـێژنی ڕۆژو
قــــبوڵ بــــێ تــاعەت و ئــێحسان و نــوێژو
«هیوا» داخوازی وەعدەی حەوزی کەوسەر
«مــحمّد» شــافیعی گــەل ڕۆژی مــەحشەر

*** 

جیژنی ڕەمەزانی ساڵی ١٣٦٥ ی کۆچی هەتاوی
مەهاباد مزگەوتی سور

# میعراج نامە

ئەی موحەممەد، ئەی موحەممەد، ئەی حەبیبی زاتی حەق
مانگ لە ئیعجازی ئیشارەی قامکی شادەی تۆ بو شەق
لێت موبارەک چونی میعراجێ، بە فەرمانی خودا
تۆ لە مەککەی بوی کە جوبرائیل گەیاندی پێت، نیدا
کاتێ جوبرائیل دەهاتە دەرکی تۆ، مەئموری حەق
دەعوەتی کردی بۆ خزمەت حەق، بە بۆنەی ئەمری حەق
بۆ تۆ راگیرابو بوڕاق، تاکو سوار بی بۆ حەوا
سواری بوڕاق بوی فڕی تیژ تێپەڕی هەر وەک هەوا
تۆ دەگەڵ جیبریل فڕی بۆ ئەرزی وادی ئەلعەتیق
دوایە بۆ «أَقصىٰ» فڕین و ڕێگەتان ڕوون و دەقیق
تۆ بۆگشت پێغەمبەران، نوێژت دەکرد لەو ڕێگەدا
ئاشنا بوی بۆ هەمویان، کردیان پێت ئیقتیدا
کاتێ چون بۆ ئاسمانان، هەر لە بەیتولمەقدیسێ
هەر جێیەک ڕوت تێ دەکرد تۆ، بوی گوڵێکی مەجلیسێ
حەوت سەمات پێوا بە یەک دەم، هەم هێنات ئادابی دین
تا موسڵمانان بە باشی ڕێک کەون، سالم بژین

تــۆ عـرٍوجت لەحــزەیی بــو، چــویتە تــەشقی ئــاسمان
ئەمری حەق بوو ویستی حەق، پێویست نەبو وەخت و زەمان
ئــەی مـوبارەک بــێ لە تـۆ، ئـەو عـیزز و شـان و شـەوکەتە
هەرچی تۆ هێنات بۆ ئۆممەت، دیاری‌یە و هۆی ڕەحـمەتە
ڕەحمەتە هۆی ڕەحمەتە، هۆی ڕەحمەتەو هۆی ڕەحـمەتە
کــردەوەو ئــاکـاری جـوانــی تــۆ، نـیشانەی وەحـدەتە
هــەر بــە هــیوایــە «هــیوا»ش، دەسـتەودوعا بـۆ ئـاسمان
ڕەســتگار بـێ و قـەت نـەبێ هـەرگیز لە زومـرەی عـاسیان

«هـیوا»

# جێژنی میعراج[1]

جیژنی میعراجی رەسولی ئەعرەمە     ئەشرەفی ئەولادی حەوواو ئادەمە

**

موسوڵمانان، موسوڵمانان، موسوڵمان
موبارەک جێژنی میعراجێ لە هەموان
موحەممەد، ئەی موحەممەد، ئەی موحەممەد
موبارەک چونی میعراجت موحەممەد
موحەممەد شەوچرای ڕێگەی هیدایەت
موحەممەد مەشعەلی شەمعی ویلایەت
موحەممەد موستەفا و تاها و ئەمینە
موحەممەد رەحمەتەن لیلعالەمینە
«موسوڵمانان، موسوڵمانان، موسوڵمان
موبارەک جێژنی میعراجێ لە هەموان»

بە بۆنەی مێعراجی پێغەمبەر«ص»

مەهاباد خەزەڵوەری ١٣٧٤ی کۆچی هەتاوی

---

١- جێژنە ئایینی‌یەکان دە ئەسڵدا دو جێژنی ڕەمەزان و قوربانە بەڵام پێویستە بزانین جێژنەکانی وەک میعراج، مەولود، بەرات چونکە موسڵمانان عەلاقەیان زۆر پێ بون، بونەتە عورفی شەرعی و نوێژی جێژنیان تێدا بەڕێوە ناچێ.

# جێژنی نیوەی مانگی شەعبان «جێژنی بەرات»[1]

موبارەک جێژنی نیوەی مانگی شەعبان
موبارەک مانگی قەدر و ڕسق و ئیحسان
کە فەرمویە موحەممەد، دەوشەوەیدا
خودا فەرموی لە زۆربەی عام و خاسان
بە قەد موی گشت پەزی عێلی بەنی کەلب
دەبەخشم ئۆممەتی تۆ، سوک و هاسان

١- جێژنە ئایینییەکان دە ئەسڵدا دو جێژنی ڕەمەزان و قوربانە بەڵام پێویستە بزانین جێژنەکانی وەک میعراج، مەولود، بەرات چونکە موسڵمانان عەلاقەیان زۆر پێ بون، بونەتە عورفی شەرعی بەڵام نوێژی جێژنیان نیە.

## چاری بێچاری

بە نوری خوا ئەگەر ماڵی دڵم ڕوناک نەکەم، چبکەم
بەگرشەی شەوچرای وەحدەت دەرونم پاک نەکەم، چبکەم
بەهاری نامرادی گەر بە سەرما هات بە دو قۆڵی
ئەگەر بۆ خوا، بە بیری خوا، برینم چاک‌نەکەم، چبکەم
ئەوەی بوومەو، هەچی دەمبێ، ئەگەر بڕوا بە جارێکی
بە سەبر و حەوسەلەو هیوا، شوکر بۆ تاک نەکەم، چبکەم
لە زوربە و زۆری بێدادی زەمانە، گەر نەناڵێنم
براو دۆست و رەفیق و خزم وکەس خەمناک نەکەم، چبکەم
ئەگەر نەفسم بکا زۆریو بە ناحەق لێم گڕو بگرێ
بە حەق،گەر نەیکوژم ئاخر، نەفس گەر خاک نەکەم، چبکەم
لە دنیای پڕ لە «هاڵۆز»ی ژیان سورما سەری حاجی
بە «هیوا» گەر سکاڵایە لەبەر بێ باک نەکەم، چبکەم

٢٩ ی پوشپەڕی ١٣٦٦ی کۆچی - هەتاوی

مەهاباد « هاڵۆز - هیوا»

## بەیانە

ئێستا کە سەحەر سوبحی زووە و کاتی بەیانە
زوو هەستە لە خەو، بیرکەوە لەو چەرخ و زەمانە
دەسنوێژ بگرە، خۆ مەگرە، ڕوو دە خوداکە
بۆ نوێژی بەیانی، کە دەمی بانگی بەیانە
ئازادە هەوا، ڕونە حەوا، تەنبەڵی بەسسە
بنوێنە لە خۆت کاری جوان مەگرە بەهانە
دارپڕگوڵە، سەحرا چەمەنە، وەرزی بەهارە
گوڵ بگرە بە دەس، گوڵ بڵێ چون مانگی گوڵانە
خەملیوە وڵات، سەوزە زەوی، سورە کەژ و کێو
پڕ عەترەو ڕازاوەیە، ئەو شاخ و تەلانە
هوشیاربەوە، گوێ بگرە، بە ئەو حاڵ و هەوایە
بڕوانە وڵات، نەغمەی نەی، بەندی دڵانە
ئەرکت لە سەرە، تۆش بۆ خێزان و کەس و کارت
تێکۆشە هەوڵدە، ئەوە خۆی ڕەمزی ژیانە

ئەی لاوی وەتەن هەستە لە خەو، ڕاپەڕە زووبە
هیممەت کە ئەتۆش کارێ بکە، کیژ و کوڕانە
دوژمنتە جەهل، غەفڵەتە خەو، ڕۆبە کتێبت
بنگێوە جەهل، چون قەڵەمت تیر و کەوانە
فکرت لە کتێب و قەڵەم و دەرس و دەور بێ
بخوێنە دەرس، وردبەوە لێی، چاکی بزانە
بیرێ بکەوە بۆچی ئەتۆ هاتویە دنیا
بۆ کوێ دەچی، چت کردوە، چت ناو و نیشانە
مەشهورە کوتویانە قەدیم، ئەو قسە خۆشە
ڕێویەک بگەرێ، چاترە لە سەد شێرکە لە لانە
«هیوا» وەرە تۆش هەستە لە خەو، خۆ مەبوێرە
کاتی عەمەڵ و ویردی خودا و شێعر و بەیانە[1]

سێ شەممۆ، بەرەبەیان ٢١ی مانگی گوڵان

---

١ - ئەو پارچە شێعرە بۆ بەرنامەی بەرەبەیانی ڕۆژباش کوتراوە خوێندراوەتەوە.

# هەست و هیوا

هـومێدو هـێزو هیواو هـەوڵی هـەرمان
هـەمیشە بـا هـەبێ هـەستین هـەمومان
بـناغەی کـۆشکی هـیوا دابـڕێژین
بـە هـێزی هـیممەت و بـڕواو و ئیمان
نـەهاتی و نـەکبەتی وێکـڕا بـنێژین
دەبـێ داری یـەئس بـبڕین بە هـەموان
هـەتا دوایـی پـەشیمانی نـەکێشین
لەکردەی خۆ نـەبین قـەتقەت پـەشیمان
دەبێ لاوانـی مـە، جۆرێک هـەوڵ دەن
بە شانازی بـژین، هـەر خـۆش بـێ دڵـمان
بە تێکڕایی زەوی خۆشبەختی شین کـەین
بە هۆی هەوری هومێدو دەرکـی قـوڕئان
بـە تـەگـبیر و ئـیرادە وا بکـەین کـار
نـەخیچێ چـیدی لەو ڕۆژگـارەگـەلمان
«هـیوا» دەستەو دوعـایە بـۆ گـەلی خـۆ
بـە سـەربەرزی بـژین یـا خـودا هـەمومان

٢٦ی خەزەڵوەری ٧٣ی کوچی هەتاوی

« هیوا »

## سرودی وەحدەت

ئـــــەو رۆ لە دنـــــیایەدا گـــەلی ئـــێران ســەربەرزە
گـــەنجانی ڕۆژی خـــەبات دەخورن وەک شێری شـەرزە

ســـەرزەمینم جـــێی گـەشتە چ تـــــاران و چ ڕەشـــــتە
مـــــەهابادی خـــوێناویش هـەر وەک بـاغی بـەهەشتە

خـــۆشی بـــۆ گـەلی ئـێران پـــێکەوە هـەر وەک بـران
پشـــتی دوژمـــن دەشکـێنن بـــۆ یـەکتر پشت و پـەنان

شـــانازی بـۆ گـەلی کـورد یـەکـیەتی یەو ڕێک کـەوتن
شان بە شـانی یـەک بـە عـام وێکـــڕا ڕەدوژمـن کـەوتن

ئـــێمە کـــورد و ئـــەمینین بـــە ئـــیمان و بـــە دیـــنین
ئـــاڵا هــــەڵگری ئـــیسلام ڕۆڵـــــەی ســــەلاحەددینین

هـــەمو گــــەلی مـوسولمان بـــە بـــیر و بـــڕوا و ئـیمان
وەحدەت[1] ڕەمزی پیرۆزی خـــودا، «مـحمّد»، قـوڕئان

«هـــــیوا» دەپـــــارێتەوە بـــەری بـــەیان بـــە هـیوا
مـــوسوڵمانان پـــیرۆز بـــن بـــژین بـە هـەست و هـیوا

---

١ ـ حەدیسی نەبەوی: إتّحدوا إتّحدوا .....

عەقڵەکان کۆمەک بە عەقڵی تۆ دەکەن
هەر بە شورا دەرک و فامێ کۆ دەکەن

***

## پرس و ڕا

بـــە نـــێوی خـــودا بــە بـیر و ڕا بــن
دەگەڵ یەک ڕاست و یەکڕەنگ و چا بن
بــە ڕا و تــەگــبیر کــار بکــەن کــاکــە
پـرس و ڕا بـە یـەک، ئـاکـامی چـاکـە
پـــێغەمبەر لەگـــەڵ ســـەحابەکــانی
بــە شــوڕا دەیکــرد کـار کـە دەیـزانـی
«أمــرُهُم شــوریٰ» نــەسسی قــوڕئانە
عـــەمەل بــەو ئــایە بــە هــۆی ئـیمانە
کارێک حەستەم و بەگرێ و پوچەڵ بێ
بــە شــوڕا[1] بـرا بـۆ تـۆش حـەل دەبـێ

---

١- ئیشارە بە ئایەی شـەریفەی : «وَأَمـرُهُم شـوریٰ بَـینَهُم» وە ئـایەی «وَشاوِرْهُمْ فِى ٱلأَمْر»

بــەڵام مــەشورەت بــە پــیاوی عــاقڵ
لێـــزان و پســـپۆر ئـــەمین و عـــادڵ
موشکیل حەل دەکا، گەلێک بە پاکی
مەشوەرەت دەگەڵ، چاکان بە چـاکـی
کـــۆمەلێک نــەیبێ بــە شــورا ئــیمان
مــەحکومە ئــاخر بــە مــەرگ و نــەمان
بــە شـورا «هـیوا» ئـەتۆش بـە جـوانـی
لە کـــار نــاکـێشی قــەت پــەشیمانی



١٥ ی سەرماوەزی ١٣٦٩ ی کۆچی هەتاوی

« هیوا»

**پێغەمبەر فەرمویەتی : إغتَنِم خَمساً قَبلَ خَمسٍ.**
حەیاتَكَ قَبلَ مَوتِك و صِحّتِكَ قَبلَ مَرَضِكَ وَفراغَكَ قَبلَ شُغلِك وَ شبابَك قَبلَ هَرَمِك وَ غناك قَبلَ فَقرِك.

**شەرحی ئەو حەدیسە پێنج رستەییە بە شێعر[1] :**

هەر وەکو ماڵ و زمین و ملک و باغیش سەروەتە
سەهمی ئاتاج و فەقیری لێ بدەی بێمیننەتە
عەقڵ و هۆش و بیری تیژیش سەروەتە و سەرمایەیە
گەر دەکاری خەی لە جێی خۆی، چاکەیە و هۆی خزمەتە
قەدری جوانیش چاک بزانە، بەر لەوە پیر بی ئەتۆش
رێزی ساغیش پێش نەخۆشی لانەدەی لەو دەرفەتە
کاتی ئاسایش لە دەس نابێ بدەی پێش چەوتی ژین
هەم بناسی کاتی ژین و دەرکی کەی ئەو نێعمەتە
فرسەتیش نابێ لە دەست چێ، بەرلەوەی مەشغول ببی
هەم دەرک کەی سەردەمی ژین، مەرگ لەپڕە و هەڵمەتە
چونکو پێویستی گەلە پەخشان و شێعر و گفتی خۆش
شێعری جوانی حاجی قادریش رایگانە و بێمنەتە
مەهاباد ١٣٧٧/٣/١٣ کۆچی هەتاوی

---

١ ـ ئەو حەدیسە حەدیسێکی هەرە بەرزی پێغەمبەری مەزنە درود و سڵاوی خوا لەسەر وی و ئال و ئەسحابی بێ کە ریوایەت کراوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و بە حەدیسی سەحیحیش نێوی دەرکردوە. شیاوی باسە ئەو حەدیسە دەبەرنامەی بەرەبەیانی رادیۆ مەهاباد دا باسی لێکراوە منیش ئەو حەدیسەم کردە شێعر و لە بەرنامەش دا نیوەچڵ بڵاو بۆوە.

# ئیمان

ئیمان بە مانای باوەڕەو یەقین — پێویستە و لازم بۆ چۆنیەتی ژین

کەسێک ئیمانی هەبێ بە باشی — بە فیڕۆ ناچێ هەوڵ و تەلاشی

ئیمان و ئەخلاق، ئەخلاق و ئیمان — پێویستی یەکن بۆ پیاوی لێزان

ئەمەش شتن مایەی رزگاری بەشەر — گەر لە ژیاندا بتبن هەتا سەر

ئیمان و ئەخلاق، ئەمانەتداری — ئیخلاس و ئێحسان هەم پارێزگاری

***

لەو ژنانەی وا لە سەدری ئیسلام
ئیمانیان هێناو ماونەوە خۆشنام
یەکیان «خەدیجە» نازناوی کوبرا
کچی خووەیلید پێی کوترا، بوشڕا
دوهەم «ئەسمەئەی» بوبەکری سیددیق
باب وکچ هەر تک دینیان کرد تەسدیق
سێهەم «ئوممولفەزل» ژن حەزرەت عەبباس
ئیمانی هێنا بو بە باس و خواس
چوار «ئوممی جەمیل» فاتیمەی خەتتاب
جوابی عومەری داوە بە عیتاب
پێنج «ئوممی ئەیمەن» جاریەی عەبدوڵڵا
ئازادکراوەی بێ کێشە و هەڵڵا
وەعدەی دا بە وان شەخسی پێغەمبەر
پاداشیان دەدرێ لە ڕۆژی مەحشەر

ڕەمەزانی ساڵی ١٣٦٦ ی کۆچی هەتاوی

# ئیرادە و ئیمان

عـــەزم و ئـــیرادە و ئـیمانی قـەوی گـەر کـەسێک بیبن، نـابێ سـەرنەوی
بـە هـۆی ئـیرادە و تـەگـبیر و رادە کەند و کۆسپی خۆت لە سەر ڕێ لادە
بە نـاوی خـودا دەست پـێبکە کـارت تـاکـو لە لێـژی نـەکـەوێ بـارت
چون هەر کەس باری بکـەوێ لەلێـژی دەڵـێن هـیچکەسێک خـاسی نـاێژی
کـەسێک نـەیەڵێ لەدەستچـێ هـەلی هۆی سەر بـەرزییە بـۆ خـۆیوگـەلی
ئـامانجی بـەرزی بـاش ئەباتە سـەر بە ئـاکـام ئەگـا بـێ خـۆف و خـەتەر
ئیرادەی قـەوی و نـەخشی وی لە ژیـن گـرینۆک بـە هـۆی دێ وەپـێکەنین
کـــەسێکی بـــیبێ ئـیرادە و ئـیمان دوژمـــن لە دەســتی دێـتە ئـەلئەمان
ئـەگـەر نـەیەڵێ هـەلی لەقـیس چـێ تـا هـەیە لە ژیـن قـەت نـاخیچێ
«هـیوا» گـەر بـیرت لە کـردەی بـاشە دەست مـایەی چـاکـە بـۆ تـۆ بـەلاشە
هـــەتا دەکـــاردا بـە بـیر و ژیـری بـە دڵ جـوانـی و بـە بـیرت پـیری

چاکە و چاکەکار هەر سەر دەکـەوێ
وەعـدەی خـودایـە هـەرگیز نـاکـەوێ

# چەند کورتە شێعر:

## ئینساف و عەداڵەت

ئینساف و عەداڵەت دو سفەت هۆگری ژینن
هەرتک کۆڵەکەی مەحکەمی پڕبایەخی دینن
هەر شوغڵ و مقامێکی کەسێک ببێ لە دنیا
بەو دوانەوە بێ شک گوڵی سەرتۆپی زەمینن

* * *

لەو ماڵە دو دەرکە، کە لە دەرکێکیەوە دێی
لەو دەرکی دوهەم دەڕۆیو ئەمجارە دەڵێی
نەتبیستووە نەتدیوە ئەگەر سەد ساڵ بی
ژینت هونەرت دەباش بزانە کە تۆ کێی ؟

* * *

ئەمر بە مەعروف نەهی لە مونکەڕ
هەر کەسێک نەیکا هەم کوێرە و هەم کەڕ

* * *

## مەچۆ ژێر باری زوڵم

گەر لە هەر جێ تۆ ببینی زاڵمێک[1]
ڕێی کەوە یا زو لە بەر دەستی هەڵێ

---

١ - ئایەی شەریفەی:«لَعنَتُ اللهِ علی الظالِمین» وە ئایەی شەریفەی:
وَلاتَرکَنوا إلیٰ الذین ظَلَموا فَتَمَسَّکُمُ آلنّار»

مـەرگ بـۆ زاڵـم بـە قـازانـجی ویـە
هەر ئەمن نا شێخی سەعدیش وا دەڵێ[1]
شـاعیرم ئـازادەگـۆم و حـەق دەڵـێم
ئەی بە لەعنەت بێ کەسێکی حەق نـەڵێ

* * *

## تەوەککول بە خودا

تـەوەککـول بـە خـودای مـانای تـەلاشە
بـــە تـــێکۆشانت رســـقت بـــەلاشە
مـانای تـەوەکـکـول هـەوڵەو تـێکۆشان
بـــێکاری فکـــرت دەکـــا پـــەرێشان
وابـــژی وەک شـێر پـڕ رۆزی زۆر بـــی
نەک وەک ڕێوی شەل هەر بەرماو خۆر بی

* * *

وەرگیراوی دو بەیتی گولستانی شیخی سەعدی

نابێ[2] بژمێری بە دۆست هـەرکەس بـە نـێعمەت لێبـدا
لافـــی دۆســـتیو زۆربـــوێریو یـــاریدانو بـــرایـەتی

---

١ - ظالمی را خـفته دیـدم نـیمروز گفتم این فتنه است خوابش برده به
هر که خوابش بهتر از بـیداری است آنـچنان بـد زنـدگانی مـرده بـه
٢ـ دوست مشمار آنکه در نـعمت زنـد لاف یـــاری و بـــرادر خـوانـدگی
دوست آن باشد که گیرد دست دوست در پـــریشان حـــالی و درمـــاندگی

ئەوکەسە دۆستە کە غەمخۆر بێتو بگرێ دەستی دۆست
کـاتی تـێماویو هـەژاری و بـێکەسی و بـرسیایەتی

* * *

لە فارسی‌یەوە وەرگیراوە

شەیتان کە دەرکرا بـەتەنێ کـردی یـەك خـەتا
سەجدەی نەکرد بە ئادەم و پێی بەدبەخت کـرا
شەیتان هەزار جار چاکترە بۆ خۆی لە نوێژنەکەر
ئەو سەجدە لە بۆ ئادەمو ئەویش، ناکا بۆ خودا

* * *

خـودایـە قـانعم تـۆش مـەمکە مـوحتاج
لە رەحمی خۆت منی غەمگین بکەی گەش
نـەبم مـوحتاجی نـامەردان هـەتا هـەم
هـەمیشە ڕوم سـپی بـێ، ڕوم نـەبێ رەش
«هیوا»

* * *

بەرگی خۆشبەختی بزانە، سادە قەت دەستناکەوێ
خونچە دڵ بە خوێن دەبێ، تا لێوی دێـتە پـێکەنین
«هیوا»

# سفرەی دیانەت

بە نێوی ئەو خوای ،کە بێ شەریکە
لە شێوە و وێنە و مەکان تەریکە
ئەو خودایەی وا ،گیاندار و بێ گیان
بە یاد و زیکری دایم خەریکە
سڵاو لە ئێوە موسوڵمانەکان
ئەوەی لەکاری چاکە نزیکە
ئەو مزگەوتەی وا ئێستە دەیبینن
دەسترەنجی ئێوە و جەماعەتێکە
دەستی ئیتیحاد ڕێکی خستووە
بە یاریدەی یەک وا ڕێک و پێکە
کۆڵەکەی لەبەرد وا دامەزراوە
تا ڕۆژی مەحشەر باقیە و لێکە
ئەگەر هەزارکەس تێیدا نوێژ بکا
کەس ناڵێ بەکەس تۆزێکم جێکە
پڕ فەرش و مۆکێت قورئان و کتێب
شۆفاژ هەڵکراو عەزەمەتێکە

حوجرەی فەقێیان بۆ دەرسی دینی
تۆش بۆ بەشداران[1] ڕەحمەت بەڕێکە
داسی مەعریفەت وەکارخە ئەوڕۆ
زمهەری دوازۆژ لەو ئاشە لێکە
سفرەی دیانەت لێرە ڕاخراوە
تۆش وەرە پێشێو بەشی خۆت تێکە
بە دەستەجەمعی کارێک گەر بکرێ
نەتیجەی چاکە و بۆ خۆی شتێکە
کاری بە تێکڕا بەکەم مەزانن
لەکن خواش هەروا زۆرەو، شتێکە
عومری ئینسانیش زو تێپەڕ دەبێ
گەر سەد سالیش بێ، هەروەک دەمێکە
دنیای بێبەقا هەتا سەر نابێ
وەک هەلپەڕکێیەو سورو گەڕێکە
هەر دەبڕێتەوە و کۆتایی پێ دێ
ئاساری باقی، خۆی گەوهەرێکە
گەوهەری باقی هەتا هەتایە
قەت نابڕێتەوە، وا بەرهەمێکە

١ - ئەو کەسانەی لەو کارەدا بەشداریان کردوە.

سەدەقەی جاری و عیلمی بە کەڵك
هەرچەندە بیکەی، کەمە و بڕێکە
بەڵام کاری چاك ئەگەر کەمیش بێ
حاسڵی زۆرە و بەهرە و بەرێکە
کاری مزگەوت و مەدرسەو وەقفی
بۆ دنیا و قیامەت سەعادەتێکە
نەسلێك، میللەتێك لێی بەهرەمەندە
ژین دەبڕێتەوەو چەرخ و خولێکە
گەر شتێك خۆش بێ، پیاوزۆری دەخوا
تا لێی تێر دەبێ دەڵێ دە تێکە!
بۆ چاکە کاریش هەر دەبێ وابێ
بڵێ نۆرەمەو بڕێکم ڕێکە
دەم غەنیمەتە بۆ چاکە کردن
پێت وابێ هەر چەند، بیکەی کەمێکە
ئەوەی دەگەڵ خۆت دەیبەیە نێو گۆڕ
شەش میتر جاوە و هەودا بەنێکە
مەتاعی دنیا هەتا سەر نابێ
وەك ئاور دەچێ و گڕوکفێکە
برای موسوڵمان، بە دین و ئیمان
دەزانی دەرفەت دەڕوا و هەلێکە

سەدقەسرتهەبێ سەدکۆشکوسەدکاخ

قەبرە جێی ئاخر، قوڕ و گلێکە

عیمارەت مەکرە بۆ لەحزەی ئاخر

توشەی ئاخیرەت بۆ خۆت بەرێکە

نەوەک ئەوانەی لەناکاو دەمرن

ئەجەل ئەگەر هات پشو و دەمێکە

«هیوا» ش بە هیوا دەپارێتەوە

دوعاگۆی ئێوە و قەوم و گەلێکە

بە بۆنەی ساز بونی مزگەوتی تازەی حاجی ئەحمەد

شەعبانی ١٣٧٣ی کۆچی هەتاوی

حاجی قادر قادری

«هیوا»

# سفارش و بەڕێ کردنی حاجیەکان

سڵاو حاجیەکان سڵاوی بەتین موبارەک لێتان ڕوکنی گەورەی دین
بڕۆن ژن و پیاو سەفەرو خێر بێ شەیتانی ڕەجیم لە داخ و کوێر بێ
هەموتان بڕۆن بە عام ڕێککەون نەک یەک بشکێنن وێکرا ڕێککەون[1]
بڕۆن ڕێکەون بێ خۆف و خەتەر ئاگادارتانن خودا و پێغەمبەر
بگەن بە ئاکام خوداتان دەگەڵ لەوێ بخوازن موشکلمان بێ حەل
بڕۆن بۆ زیارەت وێکرا بۆ تەواف بە چاوی ڕوناک ، بە دڵێکی ساف
تەوافێ بکەن بە ڕا و تەگبیر بۆ کاری دنیاش مەبن لێک دڵگیر
ئەندامی ئینسان هی پەیکەرێکن چون دەخیلقەتدا لە جەوهەرێکن
ئەگەر ئەندامێک بێشێنێ ڕۆژگار ئەندامانی دیش دەبن بێقەرار
حاجی؟ گەر دەچیە مەدینە و مەکە براوخوشکی خۆت فەرامۆش مەکە
ئەگەر دەبەستن ئیحرام بە ئیمان لە بیرو نەچێ مافی نیشتمان
کاتی بەستنان خاولی سەر شانو فەرامۆش مەکەن خزم و جیرانو
دەگەڵ حاجیەکان یەک بگرنەوە دەنگی حەق خوازیو بەرز کەنەوە
وێکرا هاوار کەن بە بانگ و سەڵا ئیسلام پیرۆز بێ، بێ دەرد و بەڵا

---

١ - ڕەپێی یەکتر مەنێن .

بــە دەنگــی بـەرز هـاوار کـەن بـە زار		لە کوفر و شیرك‌و زوڵـم و زۆر بـێزار

گــەورەترین‌مەجمەع کۆنگرەی‌حەجە		شــەیتانی گـەورە دەگـەڵ حـەج لەجـە

دەبــێ بکــوترێ حــەق بــە بیر و را		تــــۆفیقمان دەدا خـــودا ئــــینشەڵڵا

کــاتێکی دەچــنە خــزمەت پــێغەمبەر		سڵاوی مـەشیان عـەرز کـەن یـەکسـەر

بــــڵێن ئــــەوانــــیش ئـــارەزویانە		فیدای تـۆی دەکـەن هـەرچـی هـەیانە

ئــــاواتــــیان وا بــو بــبن هــاوسەفەر		بـــێنە خـــزمەتی شـافیعی مـەحشەر

لەبــــەر خـــودای خـــۆش بـپاڕێنەوە		بــــە دەســــتێکی پــــڕ بگـــەڕێنەوە

***

لە عــــــــەرەفاتێ کـــاتێ مـــانەوە		عـــارف بـــە خـوا بـن بـەوچانەوە

لە مـــــوزدەلیفە ســـەرخـــەو بشکـــێنن		رەســــــمی پــــێغەمبەر بـەجێ بـهێنن

کــاتێکی دەچـن بـۆ ڕەجـمی شـەیتان		نــەفس‌و ڕەجــم کـەن بـە بێ‌دەرەتان

وەخــــــتێ قـــوربانی دەکـەن لە مـینا		نــەفس‌و قـوربان کـەن بـە چاوی بـینا

لە پــاشی تـەواف لە دەوری حــەرەم		بە زیکری لەبەیک لە خـوانـی کـەرەم

کاتێ تـەواو بـون لە ڕەحـمەت لێوڕێژ		لە جێی ئیبراهیم، دو رەکعەت نـوێژ

پاش حەوجار سـەعی لە مـەروە وسـەفا		فــاریغ لە خــۆوبن بــە سیدق و سـەفا

* * *

بــــڕۆن بــەخێرچــن بــەخێر بـێنەوە		لە رەنــــــجی ســــــەفەر بـــــحەسێنەوە

بــە هــیوام یـاران حـەجو بـێ قـبوڵ     قوربانی خـۆوبێ مـڵك و مـاڵ و پـوڵ

«هــیوا» بــە هـیوای دوعـای بـەخێرتان     لە جیاتی هـەموان ڕەجـم کـەن شـەیتان



مەهاباد - خاکەلێوەی ساڵی ١٣٧۶ی کۆچی هەتاوی

« هیوا »

# بەخێرهاتنەوەی حاجیەکان

سڵاو حاجیەکان حەجج و بێ قبوڵ مەبروکێ مەبروکێ ، مەقبوڵێ مەقبوڵێ

بەخێر بێنەوە بەخێر بێنەوە لە رەنجی سەفەر بحەسێنەوە

رابوردوی خۆتان وەبیر بێننەوە باسی سەفەری حەج بگێڕنەوە

بزانن چونی مەدینە و مەکە بە راستی شانسە هەڵکەوتوەو تەکە

کاتێ بەستتان ئێحرام بە ئیمان لەبیرو مابو مافی نیشتمان؟

ئەو دەمەی چونە خزمەت پێغەمبەر دەردی گەل‌وکوت بە دو چاوی تەڕ

پێوکوت ئاواتی دڵ‌و دەرونتان حاسڵ بو ویست‌و ئارەزو بۆتان؟

شۆراەوەی گوناە بە دڵ و دەرون بون زاهیر و باتین خاوێن و رون بون؟

بە مەخسود گەین، هەڵسوڕا بۆتان خۆزگەم بەخۆتان، خۆزگەم بە خۆتان

شوکر حەججو کرد وێکرا هەموتان دور بون لە بەڵا، خنکان و سوتان

«هیوا» بە هاوار دەخوازێ بۆتان موبارەک لێتان، موبارەک لێتان

مەهاباد - ٨ ی بانەمەڕی ١٣٧٦ ی کۆچی هەتاوی

هیوا

# چاکی مەخسود یا داری شا مەخسود

ڕۆڵـــە شـــەوچرای هـەست و ئـەوینم
هـــومێدی هـــیوا و بـــەهاری ژیـــنم
ئـە گـەر دەوهـەوێ هـەر سـەرفەراز بن
بـــۆ ئـــازایـــەتی شـەهێن و بـاز بـن
بۆ خـزمەتی گـەل هـەڵکەوتو و شـاز بـن
قەت قەت نـەبەزن هـەر کـەیف سـاز بن
بـــڕۆن بـــخوێنن بـە هـۆی تـێکۆشان
بـــە فـیڕۆ مـە کـەن فکـرو پـەرێشان
نـــابێ غـــافڵ بـــن لە دەرس و دەورو
تـــا زایـــە نـــەبێ جـــەفاو جـــەورو
مەبن بە دەلقەک ، یـان سوک و چـروک
بـە بـێ خـاسیەت هـەر وەک نێرەموک
نە ئالەتی دەست خول بخۆن وەک دوک
لە چـــیلکە هـــاڵێن بـــبنە ئـــاڵەبوک

رەمـــــزی ســـــەرکەوتن دە بــیرورِادا
بــێ بــیر و رِادە رەنــجی بــە بـادا
لە فــێربونی شت قــەت رامــەوەستن
بــە درۆ و دەلەســە دەستو مــەبەستن
گــەر لە ســەرکــلاس خــۆو نــەخاوێنن
کــــاتی ئــیمتیحان قــەت دانــامێنن
لە ســەرکــلاسێ گــوێ بدەن بە دەرس
ئــیمتیحان بــدەن بــێ خــۆف و تــرس
بــە بــیر و بــروا و ئــیمان و دیــن بــن
رونــاکــکــەرەوەی شــەقامی ژیــن بن
کــــاتی ئــیمتیحان دەبــێ وریـا بــن
بــە دەرس و دەورو بــاش شــارەزا بــن
گــوێ بــدەن بــە دەرس لەکــن مـامۆستا
تــا رۆژێک ئــێوەش بــبن بــە وەســتا
فــەرمانی خــوایــە و حــوکمی قــورئانە
ژیــنی مــە هــەموی بــۆ ئــیمتیحانە
دایکــــی نــیشتمان بــە هــێزی ئــیمان
دوعــــاو بـــۆ دەکـا تـا رۆژی نـەمان
ئــێوەش بــخوێنن بــە بـاشی قــورئان
دەخیل سەد دەخیل، ئەمان سەد ئەمان

وەزیــــفە نــاسین زیـــنەتی پـــیاوە
بـــەو جـــۆرە ئـینسان پـڕە و تـەواوە
لە مـــــاهوارەو ویـــــدئۆ لادەن
فـــریوێ نـــەخۆن ڕەنـــجو بـــەبا دەن[1]
لە دەرس خـوێندن قـەت خـۆو مـەبوێرن
گـــەر چـــاک بـخوێنن ئـــاخر بـخێرن
ڕەفـــیقی خـــراپ خـــراتـــرە لە مـــار
ژیـــــنی دوا ڕۆژت دەکـــا تـــارومار
چـاکترین هـاودەم ئـەورۆ هـەرکتێب
کـــتێبە و کـــتێب ،کـــتێبە و کـــتێب
دایکـــی دڵســـۆزت چـــاوی لەڕێـتە
بـــــابی هـــەژارت هـــومێدی پـــێتە
ئـەمنی مـوعەللیم پـێمخۆشە شـاد بـن
نەک لات و گەڕۆل هەر ڕەنج بە بـاد بـن
پـــێمخۆشە بـبن بـە زانـا و سـەرۆک
وەک سەعاتی ساز زەمان نـاس و کـۆک

---

١ - مەبەست کەڵک وەرگرتنی نابەجێ لەو دو وەسیلە عیلمی‌یە کە بە داخەوە ئاکامی نالەباری لێ دیتراوە دەنا لە باری زانستی‌یەوە نەتەنیا زەرەریان نیە بەڵکو پێویستێکی تایبەتیشیان هەیە.

بـــــازنشەستیش بـــم چـــاوم لێـــتانە
چـــون بـــۆ داهـــاتو هـــیوام پـێتانە
نـــەک لەسـەرکـلاس دەبـیرودا هـەم
چـاوەنوارِوهـەم تـا دەژیـم تـا هـەم !
لە خـزمەت گـەلم قـەت خـۆ نـابوێرم
ئـیتر بـەدخوای خـۆم بە خـوا ئـەسپێرم
رێگـەی سـەرکەوتن «هـیوا» پـێو دەڵـێ
لەبـــەر غـــەفلەت و بـــێکاری هـەڵێ
قســـەی مـــوعەللیم بگـرن لە گـوێتان
تـــا پـــێنە کـــەنن دوژمـــنان پـــێتان
رەنـجی دایک و بـاب مـەدەن بە زایـە
بـــــۆتان نـــامێنن هـــەتا هـــەتایە
مـــەژین بـۆ زەرەر بـژین بـۆ قـازانـج
تـا هـەرچـی زوتـر بگـەن بە ئامانج
چـــاک بـــنەخشێنن چـارەنوسی گـەل
بـە خـوداو دەسپێرم خـوداتـان لەگـەڵ

دەهەمی جۆزەردان ١٣٧٣ ی کۆچی هەتاوی

«هیوا»

# سڵاو لە هەموو کەس

سڵاو ڕۆژباش لە تۆ ئەی کاکی گوێدێر
شەوت هەر ڕۆژ و ڕۆژت ڕون و پڕ خێر
سڵاو ڕۆژباش لە تۆ ئەی خوشکی دڵسۆز
بە بەختی چاک بی ڕۆژت ڕون و پیرۆز
سڵاو ئەی ئەوکەسەی گورای بە پاکی
خودای عالەم ئەتۆی گوراند بە چاکی
سڵاو ئەی ئەحسنی مەخلوقی عالەم
سڵاو ئەی نەسلی پاک و جوانی ئادەم
سڵاو وەرزێری ئاکار زێڕی دێهات
لە کاری جوانی تۆ بەرهەم بە جێ هات
سڵاو ئەسنافی دڵسۆزی بە ئینساف
بە ئینساف و سەداقەت دڵ دەبێ ساف
سڵاو ئەی کارگەر ڕەنج کێشی دڵسۆز
بە تۆی شانازیە ئەوڕۆ گەل و هۆز
سڵاو ئەی لەشکری گیانبازی سەرباز
سڵاو ئەی دایکی پیری ڕۆڵە سەرباز
سڵاو ئەی ڕۆڵەیی سەربازی ڕێبر
کە دەست و تفەنگی تۆ دوژمن دەکا شڕ

سڵاو خوشکی بەڕێز خوشکی بە پارێز
لە پاکی تۆ برات پڕ تین و پڕ هێز
سڵاو ئەی دەرس خوێنانی موئەددەب
کە دەخوێنن بە تێکڕایی لە مەکتەب
سڵاو ئەی نەو نەمامی باغی ئاوات
لە شاری یا لە سەنگەر یان لە دێهات
سڵاو ئەی مامۆسای[1] موسای عەسادار
قەناعەت پیشەتانە و ژینی ساکار
سڵاو عیسای روحوڵڵای مەکتەب
نیە ویژدانی پاکت قەت موعەززەب
سڵاو ئەی کارمەندانی شەڕفدار
قەناعەت پیشەتانەو ژینی ساکار
سڵاو بەرپرسی ڕوناک بیری دڵپاک
بەجێ بێنە وەزیفە و کار بکە چاک
سڵاوی گەرمی «هیوا» دیاریە بۆتان
بژین هەروا بە سەربەرزی هەموتان

دیاری هیوا بۆ رۆژباش
ڕەشەمەی ساڵی ١٣٦٥ ی کۆچی - هەتاوی

---

١ - مامۆستای دەرس بێژ، موعەللیم

## سرود نماز و نیایش خدا[1]

هان ای پسر هان ای پسر		ای شـاهباز خـوش خـبر
ای خــواهــرم ای بــاهنر		از بــی نـمازان کـن حـذر

* * *

ای اخــتر مــحبوب مــن		ای دختر مــحجوب مــن
ای گــوهر مــطلوب مــن		ای بچّه‌های خوب من[2]

* * *

ای آیت فـــتح و ظــفر		ای دشمن خوف و خطر
غــفلت مکـن بـنما نـظر		بــیدار شـو وقت سـحر

* * *

کبر از سرت بیرون نما		با رغبت و میل و رضـا
رو کــن بــدرگاه خــدا		با ذکر و تسـبیح و دعـا

* * *

قبل از اذان خیز، ای عزیز		بگیر وضـو پـاک و تـمیز
از غفلت و سسـتی گـریز		سستی نـیرزد یک پشـیز

* * *

پنج وعده را نماز خـوان		خود از پـلیدی وا رهـان

---

۱ ـ این سرود تقدیم به بزرگترین کنگرهٔ اقامهٔ نماز در شهرستان ارومیه شده است.

۲ ـ این سرود برای دانش‌آموزان مدارس و درج در کتاب درسی پیشنهاد می‌شود.

ذکــر خــدا را ای جـوان　　گـوييد بـا قـلب و زبـان

* * *

نـــماز نگـــهدار شـــما　　از هر خــطا ، از هــر بــلا
از نفس و شيطان و هوا　　اجـرش بـود پـيش خـدا

* * *

تزكيه كـن جسـم و روان　　يک سوره از قرآن بخوان
تـــا ســـرفراز و جـــاودان　　بــاشيد در هــر دو جــهان

* * *

ای واحـــد حـــیّ أحَـــد　　ای مَن[1] هُوالله الصّمَد
من[2]، لَم يلدِ وَلَم يو لَد　　ورد زبـــانم تـــا ابـــد

* * *

ما را زشيطان وا رهـان　　در هر زمان و هر مكان
تنها توئی روزی رسان　　روزی حلال مـا، رسـان

* * *

«هيوا» ثنا خوان شـما　　بفريادش رس، ای خدا
از هر گـزند و هـر بـلا　　بـرهانش از روز جـزا

* * *

مهاباد - حاج قادر قادری «هيوا»

نهم مهر ماه ۱۳۷۶

---

۱ - مَن : در اينجا ضمير عربی است يعنی كسی كه در واقع تنها او بی نياز است.

۲ - من : در اينجا ضمير اول شخص فارسی است در واقع شاعر مـی‌گويد ورد زبـان مـن هميشه لَم يَلِد و لَم يولَد می‌باشد.

# وەخت ناسی

دەکاتی خۆیدا کار بکرێ چاکە		درەنگ دەکاردا، زۆر خەتەرناکە
گەر کاری ئەورۆ بدەی بە سبەینێ		فاسیلەی زەمان، گەر کەوتە بەینێ
یا کارەکانت دەکەونە سەریەک		یان هەل و دەرفەت دەڕۆن لەبەریەک
بە پوختی وێکرا ناکرێن یەک سەرە		بێ نەزمی دەبێ‌و بێ‌سەرەوبەرە
هەر کار وەختی خۆی بیکەن ڕەوایە		دەکاتی خۆی‌دا، دەوا، شیفایە
کچ بە مێرد دان و ژن بۆ کوڕ هێنان		دەچاخی خۆی‌دا خۆش دەکەن ژیان
بایەخی زۆرە لەحەزەو دەقیقە		زیاتر لەگەوهەر، تەڵا و عەتیقە
هەرکەس نەهێڵێ هەلی لە قیس چێ		تا هەیە لە ژین هەرگیز ناخیچێ
بە نەزم و تەرتیب کار بکرێ جوانە		بێ نەزمی لە کار شوێنی شەیتانە
نابینی موی سەر لەبەر چی جوانە		بە هۆی داهێنان بە دەنکی شانە
هەزار جار کوتی «هیوا» بە هاوار		تا نەسلی خۆی باش، بکا خەبەردار
بەکات گەر نەکرێ، کار ئەو زەمانە		خاوەن کار ئاخر بۆی پەشیمانە
عەجەلە و درەنگ هەرتک ناجورن		بە دور لەو دوانە ساحێب شعورن
کاری ئەورۆکە مەدەن بە سبەینێ		چوزانێ سبەی چ دێتە بەینێ
وەختشناسی بە بێ وەسوەسە		نەک بۆ من و تۆ، بۆ هەموکەسە
بەجێ کوتراوە، قەدیم ئەو قسە		گەر کەسێک کەسە! حەرفێکی بەسە

مەهاباد - ٢٩ ی ڕێبەندانی ١٣٧٦ ی کۆچی هەتاوی

هیوا

بە نێوی خودای بێ وێنە

# جینایەتی ئیسرائیل - لەمزگەوتی ئەلخەلیل

هاوار ئەی موسوڵمانان / لە دەست زۆری بێگانان
لە چنگ زوڵمی ئیسرائیل / میراتگرانی قابیل
هەستن هەمو ڕێک کەون / با وەعەرزی نەکەون
بەسە درۆ و دەلەسە / کڵاو لەسەرنان بەسە
دەگەڵ یەکتر ڕێک کەون / با بەباشی سەرکەون
یەکیەتی و ئیمان بە خوا / ئێوە بۆ حەق هان دەدا
تا دوژمنو بشکێنن / ڕیشەی لە بن دەرێنن
سفرەی عەداڵەت ڕاخەن / ئاڵای حەق ڕەحەواخەن
چەند دەستەیی وەلاخەن / توشەی قیامەت داخەن

***

ئیسرائیلی سەرەڕۆ / خودا بتکا ڕەنجەڕۆ
بۆ دیسان هاوروژاوی / کێ دیسان دنەی داوی؟
بۆچی دەست هەڵناگری / وەک سەگی یانی گری
دیسان دەستی ئیستکبار / لە داوێنی گوناهکار
هاتە دەرێ و گەیاندی / خۆی نیشاندا و ڕژاندی
لە مزگەوتی ئەلخەلیل / بێ سوچ و بەڵگە و دەلیل
ڕژانە نێو ماڵە خولای / وێنەی شەیتان و بەلای
سەدان موسوڵمانیان کوشت / خوێنی هەزار کەسیان ڕشت
ڕۆژی جومعە و ڕەمەزان / بە خودای زاڵم بێ ڕەزان؟

***

ئەی میللەتی خودایی / بەس تەفرەقە و جودایی
هەستن بە هێزی ئیمان / خودا، محمد«ص»، قورئان
ڕێک کەون هێمن، هێمن / بۆ نابود کردنی دوژمن
حوکمی قورئان ئیجرا کەن / خۆو لە بەندێ ڕەها کەن

***

ئیستکباری جیهانی / ئەو نەنگەی نا سەر شانی
سازمانی میللەتان / پێیان وایە بێ خەتان!

بێ تەفاوەت لەو کارەن     پشتیوانی ئەو مارەن

ئیسرائیلی بێ ئینساف     ساف ڕێک کەوتی دەگەڵ ساف

ئەوە پاداشی ویە     ئەو شوێنەونکەو چیە

هەر بۆیە چەکو کردن     تا ئەوەو دەگەڵ کردن

لە مزگەوتی ئیبراهیم     وەک زەمانی موناخیم

ئاخر چ خوا بەردارە     کوشتارگا بێ ئەو شارە؟

شاری خەلیلوڵڵایە     موسوڵمانی تێدایە

ئەی غاسیبی خرابکار     ئەی خوێنرێژی نابەکار

بۆچ حەق کوژ و بێدادن     بۆچ بۆ گوناە ئازادن

بۆ بە بەژنو بڕاوە     کێ ئەنگۆی دنە داوە؟!

ئەی زاڵمی پەتیارە     ئەی بەدبەختی بێچارە

هەرچی تۆ دەیکەی شومە     بە تەوراتیش مەحکومە

ئەو جینایەتەت بۆ کرد     ژەهری خۆت ئاخر ڕۆ کردا!

خودا لێو هەڵناگرێ     ئاهی مەزلوم دەوگرێ

ڕۆژێک دەبێ دەکەون     ئەوان وەسەر دەکەون

تۆڵەو لێ دەستێننەوە     سەگ و شوانو دێننەوە

«هیوا» هومێدوارە     لە زوڵم و زۆر بێزارە

* **

ئەی میللەتی خودایی     بەس تەفرەقە و جودایی

هەستن بە هێزی ئیمان     خودا، محمد«ص»، قورئان

ڕێک کەون هێمن ، هێمن     بۆ نابود کردنی دوژمن

حوکمی قورئان ئیجرا کەن     خۆو لە بەندێ ڕەها کەن

* **

مەهاباد - ڕەمەزانی ١٣٦٦ ی کۆچی هەتاوی

حاج قادر قادری

«هیوا»